زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ سوپاسیکرنێ



4

# ڕەوشتێ سوپاسیکرنێ

چیرۆک: فید براکاش

وێنە: هارفندەر مانکار



وەرگێڕان و ئامادەکرن:

دیان جەمیل

زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ سوپاسیکرنێ


چیرۆك: فید براکاش

وێنە: هارفندەر مانکار

وەرگێڕان و ئامادەکرن: دیان جەمیل

پێداچوونا زمانی: مسلم عسمەت



ژمارا سپاردنێ: 2181یا سالا 2016




# سوپاس، من نەڤێت

بێریڤان زارۆکەکا بچووك و جوان بوو، وێ گەلەك یاری و بووك و ل مال هەبوون و هەموو گاڤان پشتی وانێن خوە ب دوماهی دئینان یاری بۆ خوە دکرن. ڕۆژەکێ دایکا وێ چوو بازاڕی و یاریەکا نوو بۆ کری ئەوژی یاریا پارچەیێن پلاستیکی بوو ژبۆ دروستکرنا خانیان. کەیفا بێریڤانی گەلەك ب ڤێ یاریێ هات.



هندی بیریڤان دهاتێ نەدشیا ب دروستاهی خانیەکی ژ وان پارچەیان دورست بکەت. پشتی هینگێ هەڤالا وێ سیلاڤ هاتە دەڤ وێ و داخواز ژێ کر یاریان دگەل بکەت و هاریکاریا وێ بکەت ژبۆ دروستکرنا خانیەکی چونکی وێ بەری هینگێ ئەڤ یاریە هەبوو و گەلەك جاران خانییێن جوان ژێ دروست کربوون.



بیریڤان پشتی چەندین جاران نەشیایی خانیکەکی دروست بکەت گەلەك تۆڕە بوو لەوڕا گوتە سیلاڤێ: نەخێر من نەڤێت تو یاریان دگەل من بکەی و ئەز نە پێدڤی ب هاریکاریا تەمە. ئەڤ بەرسڤا ڕەق بۆ ئەگەر سیلاڤ خەمگین بیت چونکی ئەڤە ئێکەم جارە هەڤالا وێ بێریڤان هوسا دگەل دئاخڤیت.



پشتی بێریڤان بۆ هیڤیی بووی کو نەشێت خانیکەکی دروست بکەت، پارچەیێن پلاستیکی هاڤێتنە وێرێ، وێ دیت هەڤالا وێ سیلاڤ یا ل بەر دەرگەهی و یا خەمگینە. بێریڤانی زانی وێ ڕەفتارەکا نەجوان بەرامبەر هەڤالا خوە کر لەوڕا پەشیمان بوو.



هەر ئێکسەر داخوازا لێبورینێ ژ سیلاڤێ کر و گوتێ: ل من ببوره ئەزا تۆڕە بووم چونکی من گەلەك جاران دڤیا خانیکەکی چێکەم لێ ئەز نەدشیام چێکەم لەوڕا ئەز تۆڕە بووم و من نەجوان دگەل تە ئاخفت.



سیلاڤێ گوتێ: چ نینه ئەز دێ ل تەبورم و ب تنێ من دڤیا هاریکاریا تە بکەم چونکی من بەری نوکە ئەڤ یاریە هەبوو و ئەز دزانم کا چەوا دێ ب سانەهی خانیکەکێ ژێ دروست کەم. هوسا هەردوو هەڤال پێکڤە ڕوینشتە خوارێ و خانیەکێ مەزن و جوان دروستکر و هەردوو گەلەك کەیفخۆش بوون.



# سەربوور

ئەگەر هەڤالەکا تە  ڤیا هاریکاریا تە بکەت و تە پێدڤی پێ نەبیت، ب شێوەکێ جوان بۆ بگرنژە و بێژێ نەخێر، ئەز نەیا پێدڤی مە داکو هەست ب شەرمێ نەکەت



# ئەز گەلەك یێ ب شولم

زانا و دارا و هێڤا هەرسێ هەڤالێن ئێك بوون، پشتی ژ قوتابخانێ چووینە مال هەر ئێكی دەست ب كارەكێ كر.

زانای ل مال بۆ خوە فرۆكەكا كاغەزی چێكر و دەست ب یاریان كر.



پاشی زانا چوو دەڤ هەڤالێ خوە دانای دیت یێ بۆ خوە وێنەیان دکێشیت، زانای گوتە دانای: تە دڤێت توژی یاریا فرۆکانێ دگەل من بکەی؟

دانای ب شێوەیەکێ نەیێ جوان گوتێ: نەخێر، ئەز یاریا فرۆکانێ ناکەم، پاشی بەرێ خوە ژێ وەرگرت و ل سەر وێنەیێ خوە بەردەوام بوو



زانا گەلەك ژ ڤێ بەرسڤا داناى خەمگین بوو و هەست ب شەرمێ کر چونکی وان هەموو گاڤان پێکڤە بۆ خوە یاری دکرن.



پشتی هینگێ زانا ژدەڤ دانای چوو و بریاردا بچیتە دەڤ هەڤالێ خوە هێژای داکو ئەو بۆ خوە پێکڤە یاریان بکەن و گوتێ: هەڤالێ من هێژا من دڤێت ئەم بۆ خوە پێکڤە یاریا بکەین.



لێ هێژای ژێ گوتێ: ببوره هەڤالێ من یێ خۆشتڤی ئەز گەلەك یێ بشولم و وانەییێن خوە دخوینم لەوڕا ئەز ناگەهم نوکە یاریان دگەل تە بکەم لێ هەر گاڤا ئەز ب دوماهی هاتم ژ نوو دێ یاریان کەین.



ل ڤێرێ زانای هەست ب شەرمێ نەکر چونکی هێژای ب شێوەیەکێ جوان ڕەفتار دگەل کر و ب تۆڕەیی ڤە نەگوتێ ئەز یاریا دگەل تە ناکەم.



## سەربوور

ئەگەر تە نەڤیا یاریان دگەل هەڤالێن خوە بکەی ب شێوەیەکێ جوان بۆ بگرنژە و بێژێ نەخێر من نەڤێت نوکە یاریان بکەم داکو هەڤالێ تە خەمگین نەبیت.



# کێکەکا خۆش

ئالان وڕۆژان و گولشان ژ قوتابخانێ زڤڕین، دایکا وان کێکەکا گەلەك خۆش و شیرین بۆ چێکر بوو. هەرسێ ل سەر مێزا خوارنێ ڕوینشتە خارێ و دایکا وان هەر ئێك ژ وان پرتەکا کێکی و گلاسەکا شیری دانا بەر سینگێ وان.



پشتی گولشەنێ پرتا خوە یا کێکێ هەموو خواری. دایکا وێ گوتێ: ها کچا من یا خۆشتڤی

هوسا دیارە کێك یا ب دلێ تەبوو، تە پرتەکا دی دڤێت؟

لێ وێ ب شێوەیەکێ نەجوان گوتێ: نەخێر



پشتی هینگێ ئالانی ژی کێکا خوه هەموو خوار، دایکا وی گوتێ: تە پرتەکا دی ژی یا کێکێ دڤێت؟

ئالانی ژی ب شێوەیەکێ نەجوان گوتێ: نەخێر من نەڤێت



دایکا وان گەلەك ژ ڤێ بەرسڤا وان خەمگین بوو و د دلێ خوە دا گوت: پێدڤی نەبوو ئەو ب ڤی شێوەی ڕەفتارێ بکەن و بەرسڤان من بدەن.



ل دوماهییێ ڕۆژانێ ژی کێکا خوە هەموو خوار و دەستخۆشی ل دایکا خوە کر ژبۆ بەرهەڤکرنا ڤێ کێکا خۆش و ب تام.

دایکا وێ گوت: نوشی جان بیت کچا من یا خۆشتڤی. تە پرتەکا دی ژی دڤێت بۆ تە بینم؟

ڕۆژانێ ب دیمەکێ گرنژین و ئاخفتنەکا جوان گوت: سوپاس دایکا من یا خۆشتڤی، ئەز گەلەك تێربووم و من چ پرتێن دی نەڤێن.



کەیفا دایکا وێ گەلەك ب ڤێ بەرسڤا جوان یا کچا وێ هات.

ل وی دەمی ژ نوو هاتە سەر هزرا ئالانی و گولشەنێ کو وان ب شێوەیەکێ نەجوان بەرسڤا دایکا خوە دابوو، لەورا داخوازا لێبورینێ ژێ کر و گوتێ: ل مە ببورە دادێ کو مە سوپاسیا تە نەکر بۆ ڤێ کێکا خۆش، نوکە ئەم دبێژینە تە کێك گەلەك یا خۆش بوو، دەستێن تە د خۆش بن.



کەیفا دایکا وان گەلەك ب ڤان ئاخفتنێن زارۆکێن وێ هات و دێمێ وێ پڕلابوو ژ کەیفخۆشیێ و سوزدا زارۆکێن خوە هەموو گاڤان کێکێن خۆش بۆ وان چێکەت.



# سەربوور

ئەگەر ئێكی تشتەك داتە و تە نەڤیا، ب ڕێكەكا جوان بێژی نەخێر من نەڤێت و سوپاسیا وی بکە..

